المعهد العالمي للفكر الإسلامي

(6)



# الفقه الإسلامي، نظام قانوني أصيل ومتجدّد

ندوة

دابەشکاری سەرەکیی:

کتێبخانەی (وەفایی) . سلێمانی 07701919360

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(6)



# فیقهی ئیسلامیی، سیستمێکی یاسایی ڕەسەن و نوێگەرایە

سیمینار

فيقهى ئيسلاميى،
سيستميكى
ياسا رةسةن و نويطةراية

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(٦)

# فيقهى ئيسلاميي، سيستميكى ياسا رةسةن و نويطةراية

## سيمينار

چاپی یەکەم

١٤٣٠ی کۆچی

٢٠٠٩ی زایینیی

**ناوی کتێب: فیقهی ئیسلامیی، سیستمێکی یاسایی رەسەن و نوێگەرایە**

**لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (٦)**

**چاپ: یەکەم**

**چاپخانەی: شڤان، سلێمانی**

**تیراژ: ٦٠٠ دانە**

**ساڵ: ١٤٣٠ ك – ٢٠٠٩ ز**

**ژمارەی سپاردن: (١٧٥٠)ی ساڵی ٢٠٠٩ی وەزارەتی رۆشنبیری**

**ئیمەیلی پەیمانگا لە کوردستان: iiitkurdistan@yahoo.com**

# پێشەکی

فیقهی ئیسلامیی جگە لەوەی زانستێکی پایەبڵندی نێو زانستە شەرعییەکانە، هەروەها جگە لە بەرفراوانیی و دەوڵەمەندیی و سوودمەندییە بێوێنەکەی، یەك لەو زانستانەشە کە بوونەتە ناسنامە و جیاکەرەوەی ئوممەتی ئیسلامیی لە غەیری خۆی، جیاکەرەوەیەك کە گوزارشت لە توانای داهێنان و پەرەپێدانی زانست و پێگەیشتوویی عەقڵیەت و ئاستبەرزیی زانستیی و مەعریفیی ئەو ئوممەتە دەکات.

هەرچەندە زانایان قۆناغەکانی ئەفراندن و پەرەسەندنی ئەم زانستەیان بۆ چەند قۆناغێکی کەم پۆلێن کردووە و کۆتاییەکەیان بە سەردەمێکی دوور لە ئێستا دیاریی کردووە، بەڵام خودی ئەو زانستە لە زۆرینەی سەردەم و ساتەکانی مێژووی مسوڵمانان و قۆناغەکانی فەرمانڕەواییان و ژیانی تایبەتی هەر تاکێکی مسوڵماندا رۆڵی گەورە و ئیجتیهادیی خۆی بینیوە، فیقهی ئیسلامیی هەروەها چەندین رۆڵ و قۆناغی بە پێی سروشت و پێویستیەکانی کات و شوێنەکان بڕیوە و تیایاندا سەرکەوتوانە بە سەر گرێ و گۆڵ و کێشەکانی رۆژگاردا زاڵ بووە، لە هەردوو رووی فۆرم و نێوەرۆکەوە توانای نوێبوونەوە و سەرلەنوێ رێکخستنەوەی ژیانی کەس و کۆمەڵگەکانی بە شێوازێکی سەردەمیی و هاوچەرخانە هەبووە و میللەتانی مسوڵمانی لە گێژاوی نەفامیی و دواکەوتوویی دەرباز کردووە، بێگومان سوارچاکانی ئەو مەیدانەش زانایانی پایەبڵند و فەقیه و موجتەهیدەکانی ئوممەت بوون.

هاوکاتی ئەوەی بارودۆخی زانستیی و گوزەرانی مسوڵمانان لە سەردەمە نزیکەکانی پێشوودا رووی لە بەرەودواگەڕان و پاشەکشە کرد و دەروازەکانی

ئیجتیهاد بە ناوی پارێزگارییکردن لە بنەماکانی دین بەرتەسك کرانەوە، رۆڵی ئەم زانستەش لەبەرەوە بەرەو کەمبوونەوە چوو، تا گەیشتە ئەوەی گوتاری فیقهییمان بە گوتارێکی کلاسیکیی و کۆن بناسرێتەوە، یاسا دەستکرد و مرۆڤکردەکان جێ بە حوکم و بنەما شەرعییەکان لێژ بکەن و فیقهی ئیسلامیی تەنها لە کونجی هەندێك حوجرە و خانەقاکاندا و لە ئەڵقە زانستییەکاندا بخوێنرێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، دوابەدوای دروستبوونی ئەو کەلێنە لە نێوان ئەو زانستە گەورە و کاریگەرە و کاروبار و سلوکی رۆژانەی مسوڵماناندا، زانایان درکیان بە زەرووڕەتی تێهەڵچوونەوەی هەوڵە فیقهییەکان کرد، بۆ زیاتر چەسپاندنەوە و کارپێکردنی لە واقیعی مسوڵماناندا، ئەو هەوڵەی زانا و فەقیهە مسوڵمانەکانیش هەرچەند سنوورداریش بووبێت، ئەوا دەکرێت ناوی بزووتنەوەی نوێکردنەوەی فیقهی ئیسلامیی لێبنرێت. ئەمڕۆ کەم نین ئەو زانا و فەقیهانەی بە ئاڕاستە و شێوازی هاوبەش و جیا بانگەشە و کار لەسەر نوێکردنەوەی ئەو زانستە شەرعییە دەکەن، تیایاندا هەیە کار لەسەر جەوهەر و بنەماکانی ئەو زانستە دەکات و تیاشیاندا هەیە بە وردبینیی و حەزەرێکی زیاترەوە هەنگاوی بۆ هەڵدەگرێت و بە مەبەستی بەلاڕێدانەبردنی پرۆسەی نوێکردنەوەی فیقهی ئیسلامیی، جەخت لە دانان و چەسپاندنی زەوابیتەکانی نوێکردنەوەکە دەکاتەوە، جۆر و شێوازی هەریەك لەو هەوڵانەش هەرچۆنێك بن، دواجار هەموویان دەچنە خانەی ئەو بوژانەوە فیقهییەی دەستی پێکردووە.

لقی کوردستانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامییش وەك دامەزراوەیەکی پەیوەندیدار بەوەها باسێکی زانستیی و مەعریفییەوە، بە

پێویستی زانی لەگەڵ کەسانی شارەزا و پسپۆڕی ئەو بوارە قسە و باسێك بە ئامادەیی دەستەبژێرێك لە یاساناسان و پەرلەمانتاران و زانایان و مامۆستایانی ئاینیی و ئەکادیمیی و قوتابیانی زانستی شەرعیی و نووسەر و رووناکبیران بکات، بەوهۆیەشەوە لە رۆژی (٢٠٠٩/٢/٢٦) بە هاوکاریی گۆڤاری "ستاندەر"، لە هۆڵی ئوتێل هەورامان لە شاری هەولێر سیمینارێکی لە ژێر ناونیشانی (فیقهی ئیسلامیی، سیستمێکی یاسایی رەسەن و نوێگەرایە) بۆ هەریەك لە مامۆستایان دکتۆر ئەحمەد بالیسانی و دکتۆر صەباح بەرزنجی رێك خست، ناونیشانی وتەی هەریەك لە مامۆستایانی ناوبراویش بریتیبوو لە:

- فیقهی ئیسلامیی لە نێوان نەگۆڕ و گۆڕاوەکاندا، بۆ دکتۆر ئەحمەد بالیسانی.
- گەشەسەندن و نوێبوونەوەی فیقهی ئیسلامیی، بۆ دکتۆر صەباح بەرزنجی.

لقی کوردستانی پەیمانگای ناوبراو لە پێناو گشتاندنی زیاتری ئەو سیمینارە، لە دووتوێی ئەم نامیلکەیەدا بەپێویستی زانی نێوەرۆکی وتەکان بۆ خوێنەران بخاتە روو.

**هاوژین عومەر**

**١/ی رەمەزان/١٤٣٠ی کۆچی**

**٢٠٠٩/٨/٢٢ی زاینیی**

**سلێمانی**



## دكتۆر ئەحمەد بالیسانی:

# فیقهی ئیسلامیی لە نێوان نەگۆڕ و گۆڕاوەکاندا

بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله الذي أنزل خير كلام وخير حكم للناس، والصلاة والسلام على سيدنا وحبيبنا ونبينا محمد الذي قال الله تعالى فيه: وأنزلنا اليك الذكر لتبين للناس وما نزل إليهم، والذي حول أحكام القرآن الى واقع تطبيقي متحرك محسوس كما قالت فيه أم المؤمنين عائشة رضي الله تعالى عنها كان خلقه القرآن. وعلى آله وصحبه والمسلمين اجمعين، مادامت الازمان والدهور الى يوم النشور.

به ڕاستیی دەنگی یان دروشمی نوێکردنەوەی فیقهی ئیسلامیی و نوێکردنەوەی ئەحکامی ئیسلام، لە جیهانی ئێستاماندا زۆر باوە، دەبینین هەموو کۆڕبەندو کۆنگرەو پەیمانگاکان باسی نوێکردنەوەی فیقهی ئیسلامیی دەکەن، دەڵێن پێویستە فیقهی ئیسلامیی نوێ ببێتەوەو نوێ بکرێتەوە، بەڵام لە چ بارودۆخێکدا؟ لە بارودۆخی ئێستادا کە ئێمە لە ژێر چەتری نائیسلامییدا دەژین، لە رۆژگارێکدا کە هەژموونی رۆژئاواو بیروباوەڕ و هزرەکانی رۆژئاوا بەسەر موسڵماناندا بڵاوبووەتەوەو زاڵ بووە، شەریعەتی ئیسلام وەپاش دراوەو جێبەجێ ناکرێت، دەبینین هەموو حکومەتەکانی جیهان شەریعەتی ئیسلامیان وەکو یاسا پشتگوێ خستووە، مەگەر لە بوارێکی تەسکدا نەبێت وەك یاسای باری کەسێتیی (الاحوال الشخصية)، یان هەندێك رێسای گشتیی لە بواری موعامەلاتدا.

لەو بارودۆخەدا باس لە نوێکردنەوەی فیقهی ئیسلامیی دەکرێت، من سوپاسی ئەو بەڕێزانە دەکەم کە لەناونیشانی سیمینارەکەدا نووسیویانە (تجدد) و نەیان نووسیوە (تجدید)، چونکە (تجدّد) دەقیقترە لە (تجدید)، فیقهی ئیسلامیی خۆی نوێ دەبێتەوە لە بواری جێبەجێکردندا ئەگەر جێبەجێ بکرێت، ئەگەر بێتە گۆڕی کارکردن خۆی خۆی نوێ دەکاتەوە، ئەگەر لە گۆڕی

کارکردنیشدا نەبێت، پێدەچێت نوێکردنەوەی تووشی کێشەی ئایینیمان بکات، چونکە ئیسلام بۆیە هاتووە حوکمڕانیی پیێ بکرێت، لە هەموو لایەنەکانی ژیان: لایەنی ئاینیی، کۆمەلأیەتی، ئابووریی، رامیاریی، پەیوەندیی دەولەت لەگەڵ دەولەتەکانی تر و هەموو لایەنەکانی تری ژیان دەگرێتەوە، شەریعەتی ئیسلام کە پێکهاتووە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت)، بە فیقهەوە کە پێکهاتووە لە تێگەیشتنی زانایان، هەمووی کاری پیێ کراوە لە زەمانی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێبێت)، کە یەکەم دەولەتی ئیسلامیی دروست کرد لە مەدینەی مونەووەرە، کارکردن بە فیقهی ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام بەردەوام بوو تا سالەکانی دوای دەولەتی عوسمانیی، کە سولتان سولەیمانی قانوونیی هاتە سەر حوکم، تێکەلیی کرد لە نێوان فیقهی ئیسلامیی و یاسای ولأتەکانی خۆرئاوا، لە ژێر دروشمی چاکسازیی یاسایی، زۆر شتی لە فیقهی ئیسلامیی گۆڕی، دوایی کەمال ئەتاتورك دەسەلأتی گرتە دەست و حوکمکردنی بە یاسای ئیسلامیی هەلوەشاندەوەو هەمووی کردە یاسای رۆژئاوایی، لە دواییدا کە شەڕی دووەمی جیهانیی هەلگیرسا دەولەتی تورکیا بووە هاوپەیمانی ئەلمانیاو بن کەوتن و سەرکەوتوو نەبوون، وای لێهات دەولەتی ئیسلامیی بووە نێچیرێك بە دەست ئینگلیز و هاوپەیمانەکانیەوە، حوکمی ئیسلامییان هەلوەشاندەوە و لە جیاتی شەریعەتی ئیسلامیی یاسای رۆژئاوایان دانا تەنها لەو شوێنانە نەبێت کە نەیان توانی یاسای رۆژئاوایی دابنێن، وەك باری کەسێتیی (الاحوال الشخصية)، چونکە باری کەسێتیی بە دین ژمێردراوە.

فیقهی ئیسلامیی نویێ دەبێتەوە و خزمەتی خۆی دەکات ئەگەر حوکمی پێبکرێت و لە ژینگەیەکدا کە جوولەی هەبێت، لە ژێر ژینگەی ئیسلامیدا هەر

کێشە و تەنگوچەڵەمە و قەیرانێك دروست ببێت فیقهی ئیسلامیی چارەسەری خۆی بۆ دەدۆزێتەوە. ئەگەر سەیری فیقهی حەنەفی بکەین، دەبینین واقعیتر و پتەوترە لە فیقهی مەزهەبەکانی تر، ئەگەر چی خۆم شافیعی مەزهەبم، بەڵام حەق دەبێت بوترێت، چونکە فیقهی حەنەفی لە زەمانی دەوڵەتی عەبباسیی و عوسمانیی کاری پێدەکرا، کە کاری پێدەکراو تووشی کێشە دەبوون داوایان لە زانایان و موجتەهیدان دەکرد ئەو کێشەیە چۆن چارەسەر دەکرێت؟ زانایان چارەیان بۆ دەدۆزییەوە لە ژێر ژینگەی ئیسلامییدا بە گوێرەی فەرمایشتەکانی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت)، کەوابوو فیقهی ئیسلامیی خۆی نوێ دەبووەوە نەك بە تۆبزیی نوێ بکرێتەوە، چونکە کە لە کۆڕی جێبەجێکردندا بوو، پێویست بوو حوکمی نوێ بدۆزێتەوە بۆ ئەو شتە نوێیانەی کە دروست دەبوون لە ژێر سێبەری کارکردن بە ئیسلام، بەڵام ئەگەر ئێمە لە ژێر سێبەری کارکردن بە بیروباوەڕی رۆژئاواییدا، یا هزری نا ئیسلامییدا بین، ئەو کێشەو قەیرانانەی کە دروست دەبن لە ژێر کارکردن بە رژێمی سەرمایەداریی بۆ نموونە دەیڵێم، لێرەدا ئیسلام بەرپرس نییە لەو کێشەو قەیرانانەی کە دروست دەبن لە ژێر سێبەری رژێمی سەرمایەداریی و عەلمانی، ئیسلام بەرپرس نییە تا پێی بڵێین وەرە ئەو چارەسەرمان بۆ بدۆزەرەوە، چونکە ئەوان دروستیان کردووە پێویستە خۆشیان چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، ئیسلام چارەسەر بۆ ئەو کێشەو تەنگوچەڵەمانە پەیدا دەکات کە لە ژێر سێبەری جێبەجێکردنی حوکمی ئیسلامدا دروست دەبن، ئێستا وەك دەزانین سوو (ریبا) بووەتە نیزامێکی جیهانیی، وای لێهاتووە موسڵمان ناتوانێت لە ماڵی خۆی لە ڕیبا دوور بکەوێتەوە، فەرموودەی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لێبێت) لێ هاتووەتە جێ کە دەفەرموێت: (من لم یأکل الربا

أصابه من غباره)، چونکە هەموو شتێکی ئابوورییان بە ڕیبا داڕێژتووە، بانکەکان، مامەڵەی بازرگانیی لەگەڵ دەرەوەو ناوەوە، ریبایان کردووەتە ناو هەموو کاروکردەوەیەکی ئابوورییەوە، لێرەدا خەڵکانێك پرسیار لە مامۆستایان و زانایانی ئیسلامیی دەکەن، مامۆستا ئەوە فیقهی ئیسلامیی بۆچی وا دواکەوتووە؟ ریبا بووەتە پێویستییەکی ئابووریی، دەوەرن پێویستییەك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی ریبا حەڵاڵ بکەن، حەڵاڵ ناکرێت!

ریبا دەقی قەتعیی (نص قطعي) تێدایە، خوا فەرموویەتی: (وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا) کە دەقی قەتعیی تێدا بێت هێز نییە حەڵاڵی بکات، تەنها دەتوانین لە ناو مامەڵەکاندا کامە ریبایە جیای بکەینەوە لەوەی کە ریبا نییە، تەنیا ئەوەندەمان پێدەکرێت، بەڵام ناتوانین حەڵاڵی بکەین، هەروەها هەموو جۆرە حەرامەکانی تر کە کراونەتە باو، جارێك لە کۆلێژی یاسا دەرسم بە قوتابییەکانم دەوت، باسی پێنج حوکمەکەم کرد، (واجب، مەندوب، موباح، حەرام و مەکروه)، وتم: (الأصل في الأشياء الإباحة)، شتی حەرام لە ئیسلامدا ژمێردراوە، لەوانەیە بە پەنجەی دەست بژمێردرێت زۆر نییە، کەمە، بەڵام حەڵاڵەکان ناژمێردرێن، قاعیدەی شەرعییە لە ئیسلامدا دەڵێت: (الأصل في الأشياء الإباحة) واتە لە ئەصلدا هەموو شتێك حەڵاڵە، پاشان پرسیارێکم ئاڕاستەی قوتابییەکان کرد، وتم: گۆڕەپانی موباح فراوانترە یان گۆڕەپانی حەرام؟ یەکێك وتی: گۆڕەپانی حەرام، یەکێکی دی وتی: گۆڕەپانی موباح، وتم: باشە، تۆ بۆ وتت گۆڕەپانی موباح؟ وتی: مامۆستا جەنابت فەرمووت: حەرامەکان ژمێردراون، موباح نەژمێردراوە، کەوابێت نەژمێردراو فراوانترە لە ژمێردراو. بەوی ترم وت: ئەی تۆ بۆ وتت حەرام؟ وتی: مامۆستا لەم زەمانەدا بۆ هەرچی دەچین دەڵێن: حەرامە، وتم: دەزانیت بۆ؟ وتی: بۆ؟ وتم: لەم

زەمانەیەدا ڕژێمی ئابووریی و مەدەنی هەمووی لەسەر حەرام داڕێژراوە، هەر جێیەك دەچین حەرامی تێدایەو حەرامی تێکراوە، بۆیە مرۆڤی ئاسایی وا دەزانێت ئیسلام هەموو شتێکی حەرام کردووە، وتم: من کەسێکم بەو شێوەو شکڵەی خۆم بۆم هەیە بڕۆمە هاوینەهەوارەکان؟ وتیان: بەڵێ بۆت هەیە، وتم: دەی فەرموو من ناتوانم بچم چونکە لە ناو کانییەکە مەشروبیان داناوە، لەولا ژنی ڕووت دانیشتووە، ئەگەر چوومە ئەو جێیە، چەپڵەم بۆ لێدەدەن و دەڵێن مامۆستا چووەتە ئەو شوێنە حەرامە، بەڵام خۆ جێگاکە حەرام نییە، بەڵام حەرامیان کردووە بە شتی حەرام، جا هەموو لایەنەکانی ژیان: هەڵسوکەوت، بازرگانیی... هتد، بازرگان دێت دەڵێت مامۆستا ئاواو وایی دەکەم! دەڵێم دروست نییە، دەڵێت: بۆ؟ ئیتر مەگەر بچمەوە ماڵی خۆم و دوکانەکەم دابخەم، ئەمەش چونکە شێوەی بازرگانیی چ لە دەرەوە، چ لە ناوەوە، هەمووی لەسەر ڕێسا حەرامەکان دامەزراوە، لەسەر ڕێسای حەڵاڵ دانەمەزراوە، کەوابوو ئێمە کە باسی نوێبوونەوەی فیقهی ئیسلامیی دەکەین، دوو ئامانجی هەیە: یەکەم: بۆ ئەوەی ئیسلام و فیقهی ئیسلامیی فراوانتر بێت و لە کۆڕی کارکردندا بێت، لە هەموو زەمان و مەکان و ژینگەو جێگەیەك، ئەم ئامانجە شتێکی زۆر باش و شەریفە. دووەم: کەسانێك باسی نوێکردنەوەی فیقهی ئیسلامیی دەکەن و دەڵێن با فیقهی ئیسلامیی بگونجێت لەگەڵ ژیانی سەرمایەداریی و عەلمانیی و سۆشیالیزم و ئەو شتانە...، ناکرێت...، نابێت سرکە لەگەڵ شەکر تێکەڵ بکرێت، سرکە سرکەیە و شەکریش شەکرە، تێکەڵیی بکەیت تامی هەردووکیان دەگۆڕێت، ئەمە جودایەو ئەوەش جودایە، بنەماو ڕەگەزی سەرمایەداریی و سۆشیالیستی جودایە، بنەمای سەرمایەداریی عەلمانییەتە، عەلمانییەت یانی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، کە دین لە دەسەڵات جیا کرایەوە، یانی

ئازادییەکانی رەها (اطلاق الحريات)، ئازادیی رەها یانی ئازادیی سەرمایەداریی، ئازادیی ئایین، ئازادیی راو شەخسی یا کەسایەتی، ئازادیی تەمەلووك یانی ریبا حەڵاڵە، ئازادیی شەخسی یانی زینا حەڵاڵە، ئازادیی را بە رەهایی یانی هەر رایەك بێنیت با پێچەوانەی ئیسلامیش بێت، قەیناکات رەوایە، لێرەدا چۆن ئیسلام تێکەڵ دەکەن لەگەڵ یاسایەك کە حەرامەکانی ئیسلام بە حەڵاڵ دەزانێت و بە شارستانییەتیشی دەزانێت، ئەم تێکەڵکردنە مەحاڵە بە ئامانجی ئەوەی دەڵێت با فیقهی ئیسلامیی نوێ ببێتەوە بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ رژێمەکانی ئێستادا، بێگومان ئەم ئامانجە ئامانجێکی خراپەو خزمەتی ئیسلامیشی پێ ناکرێت، بەڵکو دژایەتی ئیسلامی پێدەکرێت، کەسایەتیی ئیسلام دەتوێنێتەوە لە ناو رژێمەکانی دیدا، چونکە ئیسلام کەسایەتیی خۆی هەیە، کەسایەتیی ئیسلام نایەتەدی و دەرناکەوێت ئەگەر حوکمی پێ نەکرێت.

با کەمێك باسی (فیقه) و ئیجتیهاد بکەین تا بزانین چۆن کاری پێ دەکرێت، (فیقه) وەکو فوقەهاکان پێناسەیان کردووە، فەرموویانە: (الفقه: العلم بالأحكام الشرعية العملية، الحاصل من الادلة التفصيلية)، (فیقه) زانستە بە حوکمەکانی شەرعیی عەمەلی کە وەرگیراوە لە بەڵگە تەفسیلییەکان، چ ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و چ فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت)، ئەگەر چی دەلیلی تەفسیلی هەندێك جار نیسبییە، وەك (أقم الصلاة) دەلیلی تەفسیلییە، یان خوا فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ)، موجمەلەو تەفسیلیی نییە، خوایە چۆن بتپەرستم؟ فەرموویەتی: نوێژ بکە، (أقم الصلاة) تەفسیرە بۆ (اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ)، بەڵام لە لایەکی دییەوە ئەی خوایە چۆن نوێژ بکەم؟ لێرەدا نەبووە بە دەلیلی تەفسیلیی، بووە بە موجمەل، پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (صلّوا كما رأيتموني أصلّي)، پێغەمبەر

(دروودی خوای لێبێت) کە بە بەرچاوی خەڵکەوە نوێژی کرد، سوجدە و رکوع و شتەکانی خوێند، ئەمە بووە شەرحی (واقیموا الصلاة)، کەوابوو (فیقه) زانستە بە دەلیلی تەفسیلیی و حوکم لە دەلیلی تەفسیلیی وەردەگیرێت. دەلیلی تەفسیلیی دوو جۆرە، یەکەم: (قطعي الدلالة)، دووەم: (ظني الدلالة)، (قطعي الدلالة) وەکو خوا دەفەرموێت: (وَحَرَّمَ الرِّبَا)، ریبا حەرامە، یان (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا)، دەستی دز ببڕن، یان (يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ)، واتە: ژن نیوەی پیاو دەبات لە میرات، هێز نییە ئەم حوکمە بگۆڕێت، چونکە دەلیلی قەتعیی لەسەرە، دەلیلی زەننی نییە تا ئیجتیهادی تێدا بکەیت، ئەم حوکمەش تا ڕۆژی قیامەت ناگۆڕێت، ئێستا دەرکەوت کە ریبا بووەتە هۆکاری قەیرانی ئابووریی لە جیهان، فەرەنسا دانی پێدانا کە هۆکاری ئەو قەیرانە ریبایە، چونکە هەندێك شتی لای ئێمە دیار نییە، بەڵام لای خودایە، خوا ناچار نییە هەمووشت بۆ ئێمە شەرح بکات، خوا حاکمە، ئیجماعی زانایانی ئیسلامی لەسەرە کە دەڵێن: (لا حاكم الا الله تعالى)، بەشێك لە مانای (لااله الاّ الله) بریتییە لە (لا حاكم الاّ الله)، کاتێك حاکمی دونیایی دەڵێت: ئەوە مەکەن و ئەوە بکەن، خۆ هەموو شتەکان شەرح ناکات، ئەمە نیزام و یاسایەو دەبێت لەسەری بڕۆیت. خوای گەوەرەش دەفەرموێت ئەوە حوکمەو دەبێت لەسەری بڕۆن، بۆیە موناقەشەی موشریکەکانی نەکرد، فەرمووی: (الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا)، خوا نەیفەرموو بەیع وەك ریبا نییە و ریبا ئاوایەو بەیع ئەو چاکەیەی هەیە، موناقەشەی لەگەڵ نەکردن، فەرمووی: (وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا)، خوا حاکم و موشەرریعە، یاسادانان و شەرعدانان سیفەت و تایبەتمەندیی خوایە و بۆ ئێوە نییە. بەڵام خوداش بە گوێرەی

ئیرادەو سیفاتی خۆی (أحلّ البیع و حرّم الربا)ی داناوە، ئەگەر خوا ریبای حەلالْ کردباو بەیعی حەرام بکردبا، هیچمان پێنەدەکرا، بەلاّم خوا بەیعی حەلاّلْ و ریبای حەرام کرد، موناقەشەی لەگەلْ نەکردن چونکە بەس موناقەشەی کردبا، داننان بوو بە عەقلّیەتی خەلّکەکە، مانای وایە ئێوە عەقلّیەتی تەشریعییتان نییەو ناتوانن تەشریع بکەن، تەشریع تەنیا بۆ خوایە.

لەوانەیە کەسێك بپرسێت کەوایە ئیسلام رۆلّی عەقلْ پشتگوێ دەخات، دەلّێین: عەقلْ رۆلّی تێگەیشتن دەبینێت، فوقەهاکان فەرموویانە: (الفقه، العلم بالأحکام الشرعیة المستنبطة من الأدلة التفصیلیة)، تێگەیشتنەکە بە رێگەی ئیجتیهاد دەبێت، لەبارەی پێناسەی ئیجتیهادیشەوە فەرموویانە: (إستفراغ الوسع لإستنباط الاحکام الشرعیة من الادلة التفصیلیة)، واتە هەموو تواناو خۆتی بۆ سەرف بکەیت، عەقلْ رۆلّی تێگەیشتنی هەیە، ئیجتیهاد فەرزی کیفایەیە بە دەقی فەرماییشتی خوای گەورە، کە دەفەرموێت: (فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ)، دەفەرموێت دەبێت چەند کەسانێك خۆیان تەرخان بکەن بۆ ئیجتیهادکردن لە دین، نەشی فەرموو: (لیتفقهوا في الاحکام العملیة)، فەرمووی: (لیتفقهوا في الدین)، دین هەموو قورئان و سوننەت دەگرێتەوە، قورئان پێکهاتووە لە: هەوالْ (الاخبار)، ئەحکام، ئایاتی کەونی لە ژێر دیاریکردنی بیروباوەڕ. (لیتفقهوا في الدین) یانی ئیجتیهادکردن لە: ئەحکامەکەی وەکو یاسا، ئەخبارەکەی واتە هەوالّی مێژوویی، بۆیە دەفەرموێت: (قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ)، زانستی کەونیش پێویستە بیری لێبکەنەوەو ئیجتیهادی پێبکەن بۆ ئەوەی شارستانیەتی کۆمەلّگەی بەشەریی پێش بخرێت، هەر لەسەر وشتر نەمێنن، دەبێت سەیارەو تەیارە دروست بکەن،

بۆیه فەرموویەتی: (أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ * وَإِلَى السَّمَاء كَيْفَ رُفِعَتْ * وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ * وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ * فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ) هانی ئێمەی داوە بیر لە زەوی و ئاسمان و ئاژەڵان و هەموو شت بکەینەوە، (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ)، ئەمە هەموو سەرنجی ئێمە ڕا دەکێشێت بۆ کەون و زەوی و ئاسمان جگە لەو شتانەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکانە بە یەکترەوە، بۆ زەوی و ئاسمان و هەموو شتێك گوزارشتی لێبکەین و ئەحکامی کەونیشی لێ دەربێنین، بۆیە لە سورەتی (العنكبوت) کە باسی جاڵجاڵۆکە (عەنکەبوت) دەکات، دەفەرموێت: (مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا من دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاء كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتاً وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ)، شێوەیان وەکو جاڵجاڵۆکەیە، کە ماڵۆکەیەکی دروست کردووە، ماڵەکەشی لە ماڵی هەموویان لاواز ترە. پاش ئەوە بە ئایەتێك دەفەرموێت: (وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ)، واتە تەنها زانایان نەبن نایزانن، ئەو شتە زانستییانەی کە لە زەوی و ئاسمان و فەلەکیات و ئاژەڵ و هەموو شتێکدایە، پاش ئەوەی باسی ماڵی جاڵجاڵۆکە دەکات، دەفەرموێت تەنها زانایان دەیزانن، ئەمە هاندانە بۆ زانستی ئێمە. دەبوا پێش ڕۆژئاوا ئێمە لەو شتانە تێگەیشتباین و هەوڵی پێشخستنی شارستانیەتمان بدابا، فیعلەن لە کتێبە کۆنەکاندا زانستی فەلەك و کەون و ئەو شتانە موسڵمانەکان دایان ناوە، بەڵام قەزا و قەدەر دونیا وا سوڕایەوە کە دەوڵەتی ئیسلامیی تێکبشکێت و بکەوێتە دەست ڕۆژئاوا، ڕۆژئاواش خۆپەرستن، زانستەکەیان لە دڵی خۆیاندا قەتیس کردووەو ناهێڵن ئێمە فێر ببین بە ئەندازەی ئەوە نەبێت کە سوودی ماددیی خۆیانی تێدایە، لەوە زیاترمان پێنادەن، بە پێچەوانەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیی لە فەرەنسا و ئەڵمانیا و

جێگاكانی دییەوە دەهاتن لە بەغدا فێری زانست دەبوون، دەیان وت: (زودونا بعلمكم). كەوابوو عەقڵ ڕۆڵی تێگەیشتنی هەیە، چونكە خوا دوو شتی لەبەر چاوی ئێمە داناوە. زانیان دەڵێن: (كون منظور، و كون مقروء)، بوونەوەرێكی بینراو، بوونەوەرێك كە دەخوێنرێتەوەو گویمان لێ دەبێت، كەونی بینراوەكە ئەو هەموو بوونەوەرەیە لە دەورو پشتمان دەیبینین، كەونی خوێنراوەكەش قورئانە، ڕۆڵی داوە بە عەقڵ بیری لێبكاتەوەو سوودی لێوەربگرێت بە نیسبەت كەونەوە، داهێنانی شارستانیی لێ وەربگرین، بە نیسبەت قورئانیشەوە ئەحكامی شەرعیی كە دەبێتە ڕێسای یاسا كۆمەڵایەتییەكان، ئەمە ڕۆڵی عەقڵە. كەوابوو خوا خۆی ئیجتیهادی فەرز كردووە، خوا خۆی بە ئێمەی فەرمووە ئیجتیهاد بكەن و بیر لە قورئان بكەنەوە، فەرموویەتی: (كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ)، بیركردنەوە لە ئایاتی قورئانی، ئایاتیش دوو جۆرە، یەكەم: ئایاتەكانی كەونی و ئەخبار، دووەم: ئایاتەكانی ئەحكام. بیركردنەوە لە ئایاتی ئەحكام فیقهی لێ پەیدا دەبێت، كە چارەسەری تەنگوچەڵەمەكانی كۆمەڵایەتیی پێدەكەین، لێرەدا فیقهیش مەبەستم فیقهێكی ساكارو سەتحیی نییە، چونكە زانایان بە فیقهیان وتووە: (الفقه هو الفهم الدقیق)، تەنانەت ئەسفەهانیی دەڵێت: (هو معرفة باطن الشيء والوصول إليه) ناوەڕۆكی شتەكە، لە كاكڵی شتەكان تێبگەیت، مانای وایە دەبێت (فیقه) بیرێكی قووڵ و بەرین و فراوان و ڕووناكی لێبكەیتەوە، ئەوجا دەگەیتە شتی باش و بەكەڵك.

كەوابوو عەقڵ ڕۆڵی هەیە، كە ئیجتیهاد هەبوو نوێبوونەوەی (فیقه) دەبێت، كە نوێبوونەوە هەبوو واتە ئیسلام خۆی چارەسەری تەنگوچەڵەمە و

کێشەکانی کە دروست ئەبن لە گۆڕی کارپێکردنیدا ئەکات، بەڵام بەرپرس نییە لەو قەیرانانەی کە لە ڕژێم و یاسایەکی دی پەیدا دەبن.

لێرەدا دوو کێشە هەیە. یەکەم: کەسانێك داوا دەکەن کێشەی نیزامەکانی تر ئێمە چاکیان بکەین. ئیسلام لەوانە بەرپرس نییە، با خۆیان چارەسەی بکەن، کێشەی برسێتیی و کوشتن و بڕین و بڵاوبوونەوەی ئەم هەموو تاوانانە خۆیان لێی بەرپرسن، کە لە ئەنجامی کارکردن بە ڕێساو یاساکانی سەرمایەدارییدا پەیدابوون.

دووەم: کەسانێك گە باسی نوێبوونەوەی فیقهی ئیسلامیی دەکەن، ئیجتیهاد لە شتانێك دەکەن کە ئەسڵکەیان دەقی لەسەرە، دەڵێن: ئیمامی عومەر (خوای لێ رازیی بێت) پێچەوانەی دەقی کردووە، ئیمامی عوسمان کردوویەتی و..هتد. لەبەر خاتری نەریت و بەرژەوەندیی و ئەوەو ئەوە، بەڵێ ئوسوڵی ئیجتیهاد لە ئیسلامدا کیتاب و سوننەت و ئیجماع و قیاسە، ئەو چوارە ئیجماعی لە سەرە کە بەڵگەن، ئیجماع لای ئەهلی سوننە بەڵگەیە، قیاس ئەویش ئیجماعی لە سەرە کە بەڵگەیە، هەرچەندە زاهیریی و شیعەکان دەڵێن: عەقڵ بەڵگەیە لە جیاتی قیاس، بەڵام قیاسیش عەقڵە، واتە هەر بە عەقڵ ئەکرێت، شیعەکان دان بە ئیجماعی ئەهلی سوننەدا نانێن، بەڵام ئەوانیش ئیجماعی ئەهلی بەیتیان لا هەیە، کەوابوو ئیجماع لای ئەوانیش حوججەتە، هەروەها ئیستیحسان و عورف و مەسڵەحەت، ئەوانە هەموویان بنەمای فیقهن، ئێمە ناتوانین لێیان لابدەین هەرچەندە خیلافیان تێدایە، بەڵام زانا بەرزەکانی پێشوو وتوویانە ئەوانەش ئوسوڵی فیقهن، بەڵام عورف و ئیستیحسان و مەسڵەحەت نابێت پێچەوانەی دەق بکەن کاتێك کار بەوانە دەکەین کە دەقی قورئان و فەرموودە نەبێت. بزانین ئیمامی عومەر لە چی

پێچەوانەی دەقی کردووە؟ بۆ نموونە: خوا دەفەرموێت: (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا)، دەڵێن لە ساڵی برسێتیی (عام المجاعة) کەسێکیان هێنا دزی کردبوو دەستی نەبڕی، لێرە لە دەق دەرچوو بۆچی؟ لەبەر گۆڕانی زەمان، بەڵام وا نەبوو. بەڵکو کۆیلەیەکی حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعەیان هێنایە لای کە وشترێکی هۆزی موزیینەی دزی بوو، شکاتیان لێکرد، ئەویش فەرمووی ئێوە بەندەکانتان برسیی و تینوو کردووە بۆیە دزییان کردووە، بە خاوەنەکەی وت: هەق وایە دەستی تۆ ببڕین. هەستا وەکو دەوڵەت وشترەکەی قەرەبوو کردەوە، چونکە نەیتوانیوە تێریان بکات، دەستی نەبڕین و بە کابرای ئاغاکەشی وت ئەمجارە فەرامۆشیان بکەیت سزات دەدەم، چونکە کۆیلەی تۆن، دەبێت تێریان بکەیت. بۆیە دەستی نەبڕین چونکە مەرجی دەستبڕینیان تێدا نەبوو یا نەهاتە جێ، بەڵێ دز دەستی دەبڕدریت، بەڵام چەند مەرجێکی هەیە، کە مەرج نەهاتە دی نابێت حوکم جێبەجێ بکرێت، لە هەموو یاساکاندا تا مەرج نەیەتە جێ حوکم جێبەجێ ناکرێت، یان دەڵێن: پشکی (المؤلفة قلوبهم) وەك ئایەتەکە دەفەرموێت: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ...)، لێرەدا ئیمامی عومەر ئەو پشکەی نەهێشت بۆ تازە موسڵمانبووەکان وتی: ئیسلام بەهێز بووە تازە پێویستییمان بە ئێوە نەماوە، ئەمەش راست نییە، لەبەر ئەوە نەبوو، کۆمەڵێك هاتنە لای حەزرەتی عومەر و وتیان ئێمە (المؤلفة قلوبهم)ین پارەمان بدەیە، وتی: درۆ دەکەن ئێوە ئەوە نین، مەرجەکانیان تێدا نەبوو پێی نەدان.

قسەی سەحابە ئەگەر پێچەوانەی قورئان بوو حوججەت نییە، کاتێك حوججەیە کە موتابیقی قورئان بێت و سەحابەکانیش لە ناو خۆیاندا پێچەوانەی نەبوون، ئەوجا دەبێتە حوججەت، ئەمەش کێشەی نایەوە، ئەوانەی

(المؤلفة قلوبهم) بوون بوونه دوژمنی حەزرەتی عومەر و تا فەیروزیش بە نەفرەت بێت حەزرەتی عومەری کوشت، ئەو حوکمە ئەصوەب نەبوو، من بێئەدەبی وا ناکام بڵێم غەڵەت بوو، بەڵام راست هەیە و راستتر هەیە، ئەو دەبوو بیدایە پێی.

خوا دەفەرموێت: (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ)، دایکەکان دوو ساڵی تەواو شیر دەدەن بە منداڵەکانیان، دەپرسین ئایا شیردان بە منداڵ فەرزە، یان مەندوب، یان موباح؟ راکان جیاوازن، هەندێکیان دەڵێن: فەرزە. راستە سیغەی ئایەتەکە خەبەرە، بەڵام مەبەست لەم سیغەی خەبەرە ئەمرە، وەکو خوا دەفەرموێت: (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ)، کەس نییە لە جیهانی ئیسلامیی لە زاناو نازانا بڵێت: عیددەی ژن سوننەتە یان مەندووبە، بەڵکو واجبە، هەر بە سیغەی خەبەریش هاتووە، کەوابوو شیردان ئەویش فەرزە. هەندێکیان دەڵێن: مەندووبە، هەندێکیشیان دەڵێن: نەخێر موباحە، ئینجا لێرە چی دەڵێن: وەڵا ئیمامی مالیك رەوای کرد لەسەر ئەوانەی خاوەن بنەماڵەن کە پێیان شیاو نییە شیر بدەن بە منداڵ، واجبی کرد لەسەر پیاوەکەی دایەنێکی بۆ بگرێت، لێرەدا ئیمامی مالیك پێچەوانەی دەقی کرد لەبەر عورفی بنەماڵە بەرزەکان، کە قەبوڵی ناکەن شیر بدەن بە منداڵەکەیان. تەبعەن ئەو قسەیە بە لای منەوە راست نییە، چونکە یەکەم: ئیمامی مالیك وا تێگەیشت موباحە، کە فەرمووی هەقی هەیە، مانای وایە مرۆڤ مافی هەیە موباح بکات یان نەیکات، سەرپێچی دەقی نەکرد، بەڵام ئایا قسەی ئیمام مالیك حوججەیە؟ ئیمام مالیك موجتەهیدە، ئیجتیهادەکانی یان راستن یان هەڵە، هەڵەکەی پاداشتێکی هەیەو راستەکەشی دوو پاداشتی هەیە. لێرەدا ئێمە ئەو

قسەیە بە ڕاست دانانێین، چونکە فوقەهاکان دەڵێن: ئەم ئایەتە پاش ئایەتەکانی تەڵاق هات، باس لە ژنی تەڵاقدراو دەکات. (وَالْوَالِدَاتُ) دایکی تەڵاقدراوەکە (يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ) نەك ژنی ئاسایی، چونکە کە پیاوەکە تەڵاقی دا حەقی لەسەر نامێنێت، کە هەقی لەسەر نەما دەبێت پارەی بداتێ تا شیر بدات بە منداڵەکە، ئەگەر قەبوڵی نەکرد دەچێت دایەنێکی بۆ دەگرێت، دەڵێن ئەوە پەیوەندیی بە ژنی ئاساییەوە نییە، بەڵکو ژنی تەڵاقدراوە. کەوابوو لێرەدا سەرپێچیی دەق نییە، ئەگەر سەرپێچییش بێت ئیمام مالیك هەڵەیە نەك من دەقەکە پشتگوێ بخەم و قسەی ئیمام مالیك بکەمە حوججەت و لەسەری بڕۆم و پێچەوانەی دەقی قورئان بکەم بە عورف.

یان نموونەیەکی تر وەك قەدەغەکردنی ئافرەتان لە چوونە مزگەوت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (لا تمنعوا إماء الله مساجد الله)، فوقەهاکانی مەزهەبی حەنەفی وتیان زەمانە گۆڕاوەو و خەڵکی خراپ زۆر بووە و ڕێگە لە ژنان دەگرن لەسەر جادە، کەوایە با ژنان نەچنە مزگەوت، سەرپێچیی ئەو دەقیان کرد: (لا تمنعوا إماء الله مساجد الله)، بەڵێ سەرپێچیی دەقیان کرد لەبەر ئەوەی زەمەن گۆڕاوە و تێکچووە، بەڵام ئەمە هەڵەیە، ئەگەر گۆڕانکاریی بە سەر زەمان و ئەخلاقی خەڵکییدا هات، دەبێت ڕەوشت چاك بکرێتەوە نەك دەقەکە بگۆڕدرێت، لێرەدا ژن زیانی گەورەی بەرکەوت، تا ئێستاش باجەکەی دەدات، ژن جاهیل بوو بە ئەحکامی ئیسلام، هەر کەس دەهات ئەو وەدووی دەکەوت، باشە حەنەفییەکان بۆ ژنانیان لە بازاڕ مەنع نەکرد خۆ بازاڕ خراپتر بوو، یان لە چونە سەر کانی و جۆگەلەکان؟! خۆ ئەوانە لە مزگەوت خراپترن؟ ئەمە حوکمێکی خراپ بوو حەنەفییەکان کردیان، حوججەت نییە ئایا دەبێت ئێمە بیکەینە بەڵگە کە سەرپێچیی دەق دروستە بە

نەریت (عورف)؟ نەخێر نەریتەکە هەڵە بوو، دەبوو نەریتەکە چاك بکرایە، فەتواکەش هەڵە بوو، دەبوو چارەسەری کێشەکە بکرابا، دەبوو تا ئێستاش ژن لەگەڵ پیاو بەشداریی مزگەوتی بکردبا، ئەگەر کێشە لە تێکەڵییەکەی ژن و پیاو دروست ببوایە، زۆر کەمتر بوو لەو بێدینییەی لە ناو ژناندا بڵاو بووەتەوە.

کێشەیەکی تر کێشەی نرخدانانە، لە زەمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) شت گران بوو، تا وتیان: نرخمان بۆ دابنێ، (لو سعرت لنا، قال: ان الله هو القابض الباسط الرازق المسعر واني لارجوا ان القى الله ولا يطلبني احد في مظلمة دم ولا مال)، دەمەوێت بۆ لای خوا بگەڕێمەوەو کەس داوای ستەم لێکردنم لێنەکات لە خوێن و ماڵ یانی نرخدانان ستەمکردنە لە ماڵ، کەوابوو حەرامە، دەڵێن: ئیمام مالیك لە زەمەنی خۆی مۆڵەتی دا کە نرخدانان (تسعير) دروستە بەو بەڵگەیەی زەمان و نەریت گۆڕاوە، ئەوەش وانییە چونکە دوو حاڵەت هەیە، یەکەم: ئەگەر خواست و داواکاریی (عرض و طلب) هەبوو. دووەم: ئەگەر شت شاردنەوە و قۆرخکردن (احتكار) هەبوو.

خواست و داواکاریی خەڵك شتێکی ئاساییە، ئەگەر خواست زیاد بوو شت گران دەبێت، ئەگەر کەم بوو شتیش هەرزان دەبێت، لە یاسای خواست و داواکاریی نابێت نرخ دابنرێت، دەبێت شت بێنیتە بازاڕ، وەك لە زەمانی عەباسییەکان گەنم گران بوو، داوایان کرد نرخ دیاریی بکرێت، فوقەهاکان وتیان نابێت نرخ دیاریی بکرێت، دەبێت گەنمەکەی بەیتولمال بێننە بازاڕ، کە هێنایان رێك نرخ دابەزیی. ئەو نرخدانانە بازاڕی رەش پەیدا دەکات، شتەکە خراپتر دەبێت، وەك لە زەمانی سەددام کە نرخی دیاریی کرد، لە جیاتی ئەوەی چاو تیمار بکات کوێری کرد. بەڵام ئەگەر قۆرخکردن و شت شاردنەوە نرخیان گران کرد، ئەوکاتە دەبێت حکومەت دەستێوەردان بکات. دیارە لە

زەمانی ئیمامی مالیك ئیحتیكار بووە بۆیە ڕێگەی داوە نرخ دیاریی بكرێت تا كێشەكە چارەسەر بكرێت. ئەوەمان وت كە لە ڕاستییدا سەرپێچیی دەق نەكراوە لەبەر زەمان، یان ئەوەی موخالەفەی كردووە هەڵەیە، پرسیار دروست دەبێت ئەی باشە عورف و ئیستیحسان و مەسڵەحەت چین؟ دەڵێن ئەوانە لە كاتێكدا حوججەتن كە دەق نەبێت.




## دکتۆر سەباح بەرزنجی:

# گەشەسەندن و نوێبوونەوەی فیقهی ئیسلامیی

بسم الله الرحمن الرحيم.. الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على حبيبنا محمد وعلى آله وصحبه ومن دعا بدعوته الى يوم الدين.

ئەم بابەتە لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت. یەکەم: گەشەسەندنی فیقهی ئیسلامیی، وەك چەمك و مەفهوم. دووەم: نوێبوونەوەی فیقهی ئیسلامیی.

ئەم بابەتە ئەگەر بمانەوێت هەقی خۆی پیٚ بدەین پێویستی بە کاتی زیاتر هەیە چونکە مامۆستایانی بەڕێز هەریەکە و تێبینی خۆی هەیە لەسەر موفردات و وتەزاکانی ناو باسەکە.

**یەکەم: گەشەسەندنی فیقه:**

بەشی یەکەمی باسەکەم دەمەوێت بە شێوەیەکی پوخت و چڕوپڕ باسی گەشەسەندنی فیقه بکەم. بێگومان فیقهی ئیسلامیی بە حوکمی ئەوەی زانستێکی سەربەخۆی دروستبووە لە ئامێزی کۆمەڵگای ئیسلامیی و ژیاری ئیسلامییدا، زانستێکە دەبێت ملکەچ بێت بۆ یاساکانی گەشەسەندن و پێشکەوتن، چونکە شتێك ئەگەر زانست بێت دەبێت گەشە بکات، زانست سروشتێکی گەشەسەندن و زۆربوون و فراوانبوونی هەیە لە رووی چۆنیەتی و چەندێتییەوە، واتە ئەگەر ئێمە تەنانەت قیاسی فیقهی ئیسلامیی بکەین بە (١٠) ساڵ بەر لە ئێستا دەبینین گەشەی زیاتری سەندووە، باس و لێکۆڵینەوەی زیاتر پێشکەش کراوە لە زانکۆ و پەیمانگا و حوجرەکان و لە ناو زانایانی ئایینیدا هەر کەس بە پێی خۆی بەشدارییکردنی جددی هەبووە لە گەشەپێدان و گەشەسەندنی ئەم زانستەدا، کەواتە ئێمە دەتوانین بە شێوەیەکی مەنتیقی قیاسێك بکەین بڵێین: (علم الفقه علم وکل علم خاضع لقانون التطور اذن علم الفقه خاضع لقانون التطور)، لەبەر ئەوەی زانستە، کە

زانسته ناتوانێت گەشە نەسەنێت بە تایبەتی کە ئێمە دەزانین بەشیکی زۆری فیقه بریتییە لە ئیجتیهاداتی زانایان لەمەڕ ئەو کێشانەی کە تازە پەیدا دەبن، لەمەڕ ئەو ڕووداوانەی ڕووبەڕووی تاك و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەبنەوە بە درێژایی زەمان، بە پانتایی کۆمەڵگاکان، بە قووڵایی پێداویستییەکان. ڕاستییەکەی من لە (٩) خاڵدا باوەڕم بە گەشەسەندنی فیقه هەیە کە فیقه لەبەر ئەوەی زانستە لە نۆ ڕووەوە گەشەی سەندووە.

**یەکەم: لە ڕووی پێناسەو ماهیەتەوە:**

ئەگەر تەماشای پێناسەی فیقه لەسەر دەمێکدا بکەین دەبینین یەکسان بووە بە ئایین، (من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين) واتە تێگەیشتن لە فیقه یەکسان بووە بە ئاییناسی، شارەزابوون لە ئیسلام بە هەموو وردەکاریی و تەفسیلاتیەوە، زاناکان وتوویانە ئەسڵەن فیقه لەوە فراوانتر بووە کە ئێستا پێی دەڵێن فیقه، چونکە وتوویانە: (الفقه معرفة النفس ما لها وما عليها) یانی (معرفة النفس ما لها من الحقوق ومعرفة النفس من الواجبات) ئەمە ڕەنگە لەو پێناسەیەی ئیستا هەیە فراوانتر بیت بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ فیقه بەرەو تایبەتمەندێتی چووە، بەرەو پسپۆڕی چووە، بە تایبەت ئێستا فیقه لە هەموو سەردەمێك زیاتر بەرەو تایبەتمەندێتی و پسپۆڕیی دەچێت، ئەوەی زاناکان لە ئوسولی فیقهدا کاتی خۆی پێیان وتووە: (تجزوء الاجتهاد، تبعض الاجتهاد) جیا کردنەوەی بوارەکانی ئیجتیهاد و وردکردنەوەیان بۆ زاناکان، یانی ڕێگەیان داوە کەسێك تەنیا لە بوارێکی فیقهدا پسپۆڕی وەربگرێت و شارەزا ببێت، هەروەها فەتوای لێ وەربگیرێت و حوکمی لە بارەوە بکات، ئەمە لوتکەی ئەوەیە کە ئێستا نیزامی قانونی پێیگەیشتووە کە هاتوون مەحاکمیان لە

جیاکردووەوەتەوە، پسپۆڕیی مەحاکمیان جیاکردووەەوە لە رووی: زەمان و مەکان و پسپۆڕییەکان، تەماشا دەکەیت ئەمە لە فیقهی ئیسلامییدا ئاماژەی پیێ کراوەو پێشبینی کراوە. هەرچەندە زۆربەی زۆری فەقیهەکانی ئێمە زانای مەوسوعی بوون، لەم رۆژانەدا کتێبی (مفاتیح العلوم)ی (الخوارزمي) دەخوێندەوە کە یەکەمجار لە روسیا چاپ کراوە، ئەم پیاوە لەو کتێبەدا ئاماژە دەکات بۆ زاراوەکانی زانستیی (مصطلحات العلوم)ی سەردەمی خۆی، ئەگەر ئەوە بکریت بە کوردی و پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی بکرێت زۆر تەمومژ لەسەر شارسانیەتی ئیسلامیی و زانایانی ئیسلامیی دەڕەوێتەوە، کە وادەزانن زانا و فەقیهێکی ئیسلامیی تەنیا شارەزایی لە سەرف و نەحوهەبووە، جا فیقهـ زۆر فراوان بووە دوایی بەرەو پسپۆڕیی رۆشتووەو ئێستاش زیاتر بەرەو پسپۆڕیی دەچێت، کەواتە بوارێکی گرنگی گەشەسەندنی فیقهـ لە پێناسەو ماهیەتی فیقهدا خۆی دەبینێتەوە.

**دووەم: زاراوە و چەمکەکان (المصطلحات والمفاهیم):**

ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی سەحابەی کیرام (رەزای خوایان لە سەر بێت) دەبینی ئەو زاراوە فیقهییانەی کە لە رۆژانەی ژیانی خۆیاندا بەکاریان هێناون سنووردارن، بەڵام ئێستا زانستی زاراوەی ئیسلامیی بە تایبەتی لە بواری فیقهدا زۆر فراوانە دەتوانیت مەوسوعەیەکی فیقهی ببینیت (١٠) بەرگ بێت، مەوسوعەی بنەمای فیقهی دانراوە کە چەند بەرگ (مجلدات)ـە، هەر بوارێك لە بوارەکانی زانستی ئیسلامییەوە تەماشا دەکەیت لە بواری زانستی زاراوەوە پیشکەوتنی گەورەو شایانی کردووە، ئێمە چەندین کتێبمان هەیە یان بە شێوەیەکی سەربەخۆ زاراوەی فیقهی روون کردووەتەوە،

یان لە چوارچێوەی زانستەکانی تردا روونی کردووەتەوە، یان ئێستا موعجەمی قاموس تایبەت بە یەکێك لە زانستەکانی فیقهـ، قاموسی (مصطلحات اصول الفقه) هەیە، قامووسی (مصطلحات الفقه) خۆی هەیە، قاموسی (مصطلحات فقه المعاملات) و قاموسی (مصطلحات فقه السياسة) هەیە، هەموو ئەمانە کتێبن و کاریان لەسەر دەکرێن و توێژەر و لیکۆڵەرەکان کەمتەرخەمییان لەو بوارەدا نەکردووە، کە ئەمەش گەشەسەندنێکی گەورەیە.

**سێیەم: زۆربوونی سەرچاوەکانی فیقهـ:**

ئەگەر سەیری سەردەمی پێغەمبەر (صلّى الله عليه وسلّم) بکەین دەبینین فیقهـ تەنها یەك سەرچاوەی هەبووە کە قورئانە، تەنانەت پێغەمبەر (صلّى الله عليه وسلّم) کە خۆی موئەییەدی قورئانە (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى* إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى) (النجم: ٣-٤)، کە رووداوێك هاتبێتە پێش چاوەڕوانی وەحی کردووە، ئگەر ئیجتیهادیشی کردبێت دیسانەوە چاوەڕێی وەحی کردووە بۆ پەسەند کردن، بەڵام پاش وەفاتی پێغەمبەر (صلّى الله عليه وسلّم) لەگەڵ قورئاندا سەرچاوەیەکی تازە پەیدابوو بەناوی سوننەت، دوای زەمانی خەلیفەکانی راشدین سەرچاوەیەکی تر پەیدا بوو کە بریتییە لە کۆڕای هاوەڵان (اجماع الصحابة)، دوای ئیجماعی سەحابە سەرچاوەیەکی تر پەیدادەبێت پێی دەڵێن: قیاس، ئینجا لە ناو زاناکاندا راجیایی پەیدا دەبێت دەڵێن: رەنگە قیاس نەتوانێت هەموو پێداویستییەکانمان لە خۆ بگرێت، بۆیە فوقەهای مەزاهیب هاتوون بۆ هەندێ سەرچاوەی تر وەك: ئیستیحسان، مەسالحی مورسەلە، سەدی زەریعە و عورف و مەزهەبی سەحابی ئەمانەش قسەیان لەسەر کراوە، ئەمانە لە راستییدا دەبن بە مەصادری تەکمیلی فیقهـ. ئێستاکەش فیقهـ

نەوەستاوە فەقیهانی موسڵمان دەتوانن سوود لە زانستی سەردەم وەربگرن واتە جگە لەو زانستەی خۆیان هیچ ڕێگرێك نییە لەوەی ئەوان سوود لە ئەزموونی عەقڵی مرۆیی واتە ئەوانەی هیچ دژایەتیی و پێچەوانەی لەگەڵ دەقی شەرعییدا نییە، وەربگرن. لە بواری سەرچاوە و ژێدەریشدا فیقهی ئیسلامیی رۆژ بەرۆژ گەشەی سەندووە، ئەگەر رۆژێك لە رۆژان وەستا بێت مانای وایە فیقهی ئیسلامیی راکید بووە، بەڵام لەو سەردەمانەدا کە شتی تازە دێنە مەیدانەوە هیچ ڕێگرێك نییە کە ئێمە سوود لە ئەزموونی خەڵکی تر ببینین، وەك لە سەردەمی خەلیفەکانی راشدیندا تا زەمانی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان نووسراوی دەوڵەتی ئیسلام بە زمانەکانی فارسی و رۆمی بوون، چونکە ئەزموونی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەزموونێکی نوێ بووە لەبەر فتوحات و بەڕێوەبردنی وڵات و هەر کاروبارێکی تر نەیان پەرژاوەتە سەر ئەوەی ئاوڕی جیددی بدەنەوە لە تۆمار و نووسراوەکانی وڵات، دوای ئەوە تەماشا دەکەیت دەست پێدەکات، فیقهی ئیداریی لە وڵاتدا دەست پێدەکات ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن: (القانون الاداري).

**چوارەم: بابەتە فیقهییەکان (الموضوعات الفقهية):**

بابەتی فیقهییش رۆژبەڕۆژ گەشە دەکات رەنگە هەندێك بابەت جاران زۆر جێگەی باس بووبێت بەڵام ئێستا باسی لێوە ناکرێت بۆ نموونە: باسی کۆیلەو جارییەو کەنیزەك و ئەوانە. تەماشا دەکەیت یەکێ: لە قورسترین باسەکان لە زانستی میرات (علم الميراث)دا ئیرسی جارییەو ئیرسی رەقیق و ئەمانە بووە، یەکێك بووە لەو کێشە جەنجاڵانەی لە فیقهی ئیسلامییدا هەبووەو ئەمڕۆ نەماوە. بەڵام ئێستا باسی تازە پەیدا بووە بە تایبەتی لە بواری تەکنەلۆژیای

هاوچەرخدا، ئایا گرێبەستی ئەلیکترۆنی چۆنە؟ حوکمی چۆنە؟ بازرگانی پێوەکردنی چۆنە؟ یان هەندێ شتی تازە لە بواری پزیشکییدا ئایا حوکمی توێکردن چۆنە؟ نەشتەرگەریی جوانکاریی چۆنە؟ ئەمانە چەندین توێژینەوەیان لە بارەوە دەکرێت و ساڵانە کۆنگرەی زانستییان لە سەر دەبەسترێت. ئەمە نیشانەی ئەوەیە فیقهی ئیسلامیی رژێمێکی یاسایی گەشەسەندووە، یانی لەسەر موسڵمانانیان کورت هەڵنەهێناوە دەبێت ئەم بابەتە باس بکرێت و ئەوی تر باس نەکرێت، من سەرنجێکم لەسەر وتەیەکی دکتۆر ئەحمەد بالیسانی هەیە (کە بە مامۆستای خۆیشمی دەزانم) کە فەرمووی: "ئەو کێشانەی غەیری ئیسلام دروستی کردووە، ئیسلام حەقی نییە بەسەرییەوە" بە پێچەوانەوە ئەو کێشانەی کە غەیری ئیسلامیش دروستی کردووە و رووبەڕووی موسڵمانان دەبێتەوە، موسڵمان دەبێت چارەسەری بکات. بەڵام لێرەدا قسەیەك هەیە فەقیهی موسڵمان دەتوانێت بیڵێت: تۆ چارەسەری جامیعی مانیعت دەوێ؟ یان چارەسەری جوزئی؟ بۆ نموونە کێشەی سوو (الربا) کاتێك فەقیهێکی موسڵمان دەیەوێت رووبەڕووی ببێتەوە چارەسەری جوزئی هەیە کە بریتییە لەو حیلە شەرعییانەی زانایان بۆیان دۆزیوەتەوە، ئەوپۆششانەی بۆیان دروست کردووە، بەڵام چارەسەری تەواو (الحل الكلي) بریتییە لەوەی رژێمێکی ژیان لەسەر بنچینەی ئیسلام دابمەزرێنێن، مرۆڤێك پەروەردە بکەین بە بەها و بایەخە ئیسلامییەکانەوە.

رۆژانە بابەتەکان گەشە دەکەن وبابەتی نوێ دێنە مەیدانەوە ،رەنگە لە جەوهەردا نوێ نەبن، چونکە پێداویستییەکانی مرۆڤ لە رووی جەوهەرییەوە گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە، لە یەکەمین مرۆڤەوە تا ئێستا پێویستیی بە خۆراك، پۆشاك، شوێنی نیشتەجێبوون و..هتد هەیە، ئێستاش بە هەمان

شێوەیە بەڵام لەوانەیە رواڵەتەکان گۆڕابن لە رووی جۆرەوە گۆڕابێت بەڵام جەوهەری شتەکە نەگۆڕاوە.

**پێنجەم: بوونی مەزهەبەکان (المذاهب):**

بوونی ئەو مەزهەبە جیاوازانەی لە مێژووی ئیسلامدا هەبووەو ئێستاش رێگریی نییە لەوەی مەزهەبی نوێ دروست ببێت و ئیجابیاتی مەزهەبەکانی پێشوو لە خۆ بگرێت، چونکە عەقڵ بە مەحاڵی نازانێت بەڵام ئەوەی دروست نەبووە رەنگە هۆکاری بۆ دروست نەبووبێت، کە ئێستا موجتەهیدێك پەیدا نابێت یان ئەگەر کەسێك ئیجتیهاد بکات رەنگە نەتوانێت ئەو کەسایەتییە مەعنەوییە کارایەی هەبێت لەسەر کۆمەڵگا کە خەڵك دانی پێدا بنێت، یان جۆرەها رێگری بۆ دروست ببێت. بەڵام هیچکات رێگریی نییە لەوەی مرۆڤ ئیجتیهادی نوێ بکات و ئەگەر نەشتوانێت مەزهەبی نوێ دابمەزرێنێت رێگریی نییە لەوەی روئیەی مەزهەبیی هەبێت واتە شتێك لە خوار مەزهەبەوە.

**شەشەم: زمانی نووسینەوەی فیقه:**

زمانی نووسین و ئوسلووبی بەیانکردنی فیقه یەکێکی ترە لەو خاڵانەی فیقه پێی گەشە دەکات، ئەگەر سەیری کتێبە کلاسیکییەکان بکەین ئەوانەی کە بە راستیی زانینیان گرنگە، خوێندنیان گرنگە، توێژینەوەیان گرنگە، شانازیی ئوممەتی ئیسلامیین، تەماشا دەکەیت بە نیسبەت ئەمڕۆوە زمانەکەیان ئاڵۆزە بەڵکو پێویست بەوە دەکرێت بخوینرێن، کتێبێك لە کتێبە کۆنەکان وەك: (قواعد الاحکام)ی عیززی کوڕی عەبدولسەلام رەنگە ئەو بە شێوەیەکی عادی وەك ئینشا نووسیبێتی بەڵام ئێستا یەکێك شارەزا نەبێت لە فیقه، یان زمانێکی

پاراوو بەهێزی نەبێت ناتوانێت وەریبگرێت. بۆیە پێویست دەکات ئێستا فیقھ بە زمانێکی نویێ بنووسرێت.

لە لایەکی ترەوە تەنانەت کە سەیری کتێبە فیقهییەکان دەکەین، دەبینین زۆر تەرکیز دەکاتە سەر فیکرەی واجب (یجب علی المسلم في صلاته ان تکون ثیابه طاهرة، الماء الذي یتطهر به یجب ان یکون طاهرا مطهرا) تەماشا دەکەیت زۆربەی ئەو زمانەی فیقهی پیێ نووسراوە بە پێی مەنتیقی واجبە، ئەمەت لەسەر واجبە، ئەوەت لەسەر واجبە، دەکرێت ئێستا بە شێوەیەکی تر باس بکرێت لە جیاتی ئەوەی بلێین: ئەوەت لەسەر واجبە، بلێین: پاکوخاوێنی لە ئاو و جل و بەرگدا واجبە لەسەر موسڵمان، بلێین: نەخێر مافە بۆ موسڵمان، یانی دەوڵەت دەبێت هەموو پێداویستییەکانی تەندروستی و پاکوخاوێنی دابین بکات، یانی فیقھ لە زمانی واجبەوە بێنین بۆ زمانی ماف، ئەو ئوسلوبەی فیقهی پیێ دەنووسرێتەوە دەبێت ئەمڕۆ ئوسلووبێکی پەسەند بێت، چونکە ئەو بانگەوازەی ئەمڕۆ دەیکەین بۆ گەڕانەوەی فیقهی ئسلامیی لە دوو بازنەدا دەخولێتەوە، یەکەم: لە ناو بازنەی ئوممەتی ئیسلامدا خۆیدا، دووەم: غەیری ئیسلام، لەناو بازنەی ئوممەتی ئیسلامدا ئەگەر جەخت لەسەر واجبەکانیش بکرێتەوە شتێکی باشە، بەڵام لە بازنەی غەیری ئوممەتی ئیسلامدا دەبێت و هیچ ڕێگرییەك نییە کە تەرکیز بکاتەوە لەسەر حقوق و ماف.

**حەوتەم: ڕۆڵ و ئەرکی فیقھ:**

لەسەردەمەکانی پێشوودا فیقھ خەڵکی ئاڕاستە دەکرد، خەڵکی را دەهێنا و پەروەردە دەکرد، یانی ڕۆڵێکی بنەڕەتی و میحوەری هەبوو، بۆیە دەتوانرا بە فیقھ بوترێت: زانستی کۆمەڵناسی کۆمەڵگای ئیسلامیی، فەقیهێك دەیتوانی

رۆڵێکی کاریگەر ببینێت لە ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیدا، رەوت بدات بە خەڵکەکە، ئێستا رەنگە فیقه لە رێکخستنی دامەزراوەکانی کۆمەڵگادا رۆڵ ببینێت، جاران ئەگەر لە مینبەرەکانەوە بمانتوانیبا گوێمان لە دەنگی فیقه ببێت، ئێستا دەتوانین لە رێگەی پلان و دارشتنی بەرنامەی وڵاتەوە. کەواتە فەقیهەکان دەتوانن ئیقتیحامی بن، بچنە ناو شوێنە جیاجیاکانی دەسەڵات، حکومەت و کۆمەڵگا. چونکە رۆڵیان گەشەی سەندووە، ئەگەر جاران رۆڵی فەقیه رۆڵێکی تاکیی بووبێت، یان رۆڵی ئیجتیهاد رۆڵێکی تاکیی بووبێت ئێستا دنیا دنیای ئیجتیهادی دەستە جەمعییە، کەوتە ئەمەش بوارێکی گەشەسەندووی ترە بە نیسبەت فیقهەوە.

**هەشتەم: پەیوەندی فیقه بە زانستەکانی دیکەوە:**

ئێستا لە هەموو کات زیاتر فیقه پێویستی بە کۆمەك و دەستبار گرتنە، یارمەتی وەرگرتن لە زانستەکانی ئەمرۆ، یانی فەقیه لە هەمووکات زیاتر پێویستی بەوەیە بزانێت کێشەکانی ئابووری،کۆمەڵایەتی، دەروونی، سیاسی، نێونەتەویی، ناوچەیی و نێوخۆییەکان چییە، ئەو کێشانەی ئەمرۆ رووبەرووی مرۆڤایەتیی دەبنەوە بە زانست چارەسەر کراون، فیقه رۆڵی ئاراستەکردن دەبینێت بە نیسبەت موسڵمانەوە، کەواتە زۆر پێویستە کە فیقه پەیوەندیی هەبێت بە زانستی زەمانی خۆیەوە.

کاتی خۆیشی فەقیهەکان هەوڵیانداوە شارەزابن لە زانستەکانی رۆژگاری خۆیان، بۆ نموونە: ئیبن حەزم زۆر تەرکیز لەسەر علومی ئەوائیل دەکات، کە بریتییە لە: حیکمەتی نەزەریی و حیکمەتی عەمەلی. کە رەنگە لە

ناموسڵمانیش وەرگیرابێت، چونکە لە راستییدا زانست سیفەتێکی ئایدۆلۆژیی دیاری کراوی نییە، کەسەکە بە پێی بیروبڕوای خۆی سیفەتی پیٚ دەدات.

نۆیەم: لێکدانەوەی دەقەکان: (تفسیر النصوص):

لێکدانەوەی دەقەکان پڕۆسەیەکی مرۆڤکردە، مرۆڤ ئەنجامی دەدات، مرۆڤیش لە حاڵەتی گەشەسەندندایە. دیارە تەفسیریش لە ژێر کارایی یاساکانی گەشەکردن و گەشەسەندندایە، بۆیە ئەگەر ئایەتێك بدەیت بە کەسێك کە بە بیرو بۆچون و سلووکی وەك خەڵکی ئەم سەردەمە نەبێت، لێکدانەوەیەکی ناسەردەمییانە بۆ ئەو دەقە دەکات، بەڵام ئەگەر ئەهلی ئەم سەردەمە بێت، هوشیار بێت بە کێشەکانی مرۆڤ لەم سەردەمەدا، تەماشا دەکەیت تەفسیریکی سەردەمیانەی بۆ دەکات، بۆیە لە بوارەدا ئەو قوتابخانە تەفسیرییانەی لە مێژووی ئیسلامدا دروست بوون خزمەتی زۆر گەوەرەیان بە گەشەکردنی فیقهـ کردووەو هیچکامیشیان یەکتری رەد ناکەنەوە، بەڵکو یەکتری تەواو دەکەن، یانی چ قوتابخانەی عەقڵی بێت، چ قوتابخانەی نەقڵی بێت، چ قوتابخانەی تەوفیقیی بێت، ئێمە بە گشتیی (٣) قوتابخانەمان هەیە، (المدرسة العقلية، المدرسة النقلية والمدرسة التوفيقية) هەر یەکێك لەم قوتابخانانە دەتوانێت کاریگەر بێت لەسەر گەشەسەندنی فیقهی ئیسلامیی.

بەشی دووەم: نوێبوونەوە لە فیقهی ئیسلامییدا:

ئەگەر سەیرێکی ژیانی زانا گەورەکانی ئیسلام بکەین دەبینین نهێنی گەورەییان لەوەدایە کە توانیویانە قسەی تازە بکەن، نهێنی گەورەی ئیمامی شافیعی ئەوەبوو کە توانی کتێبی (الرسالة) بنووسێت و لەو کتێبەشدا قسەی

تازە بکات، نهێنییەکانی: ئیمام غەزالی، شێخ ئیبن تەیمییە، نهێنی ئەم کەسایەتییەگەورانەی مێژوو لەوەدایە کە نەهاتوون قسەی کەسانی پێش خۆیان بکەنەوە و چاولێکەریی بکەن، بۆیە ئێمە لە مێژووی ئیسلامییدا پێشینەی زۆرمان هەیە بۆ نوێگەریی، سەیری کتێبەکەی ئیمامی (شاتبی) بکەن (الموافقات في أصول الشريعة) بەراستیی ئەم کتێبە ناوازەیە، چونکە شتێکە پێچەوانەی نووسراوەکان، ئەگەر جاران کتێبی ئوسوڵی فیقه لەسەر بنەماکانی: کیتاب، سوننەت، ئیجماع و قیاس دارێژرابا، ئەم هات لەسەر بنەمای مەقاصدی شەریعەت ئوسولی شەرعی دامەزراندو وتی: ئەحکامی شەرعی لە راستییدا بۆ تەحقیقی مەقاصدیشە، مەقصدیش بریتییە لە زەروریات، حاجیات، تەحسینیات، ئەمە قسەیەکی تازەبوو، ئێستاش هیچ رێگریی نییە لەوەی کەسێك لەو بوارەدا قسەی نوێ بکات، چونکە خوای گەورە هەموو کەسێکی کە بەدی هێناوە فێری بەیان و دەربڕینی کردووە، دیارە دەیەوێت بەرەوە کەماڵی بگەیەنێت بۆیە ئەو بەیانەی پێبەخشیوە، کەواتە پێشینەیەکی زۆر دێرین و رەسەنمان هەیە لە نوێگەرییدا، لەم سەردەمەشدا کۆمەڵێك رەمزمان هەیە لە مەیدانی فیقهدا توانیویانە نوێگەریی و نوێبوونەوە بکەن، دەتوانین بیانکەین بەسەر مەشق چونکە نەهاتوون تەقلید بکەن.

**پێویستییەکانی نوێبوونەوە و نوێگەریی:**

چەند فاکتەرێك هەن وامان لێدەکەن هەوڵی نوێگەریی بدەین، ئەوانیش بریتین لە:

١ـ نەریت (عورف): نەریتی کۆمەڵگەکانی ئیسلامیی وەك یەك نین، نەریتی ئێستاش وەك جاران نییە، ئەو گۆڕانکارییە لە نەریتدا وا لە زانایەك دەکات

کاتێك دەچێتە کۆمەڵگەیەکەوە پیاچوونەوە بە کولتوورو نووسراوە فیقهییەکاندا بکاتەوە، تەنانەت قسەکانی خۆیشی شایستەی ئەوەن پێیاندا بچێتەوە، قسەیەك بەر لە (١٠) ساڵ کردوویەتی ئێستا پێداچوونەوەی بۆ بکات چونکە مێژوو نەوەستاوەو ناشوەستێت، ئەمەش هیچ نەنگییەك نییە بۆی بەڵکو فەزڵە مرۆڤ پێ بە نەفسی خۆیدا بنێت، پەندێك هەیە دەڵێت: ئەگەر ئەسپێك ببەیتە سەر ئاوێك و بتەوێت بتپەڕێنێتەوە، تا وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا ببینێت ئامادە نییە بجووڵێت، چونکە ئامادە نییە پێ بنێت بە خۆیدا، کەسی زیرەك ئەوەیە ئاوەکە دەشڵەقێنێت بۆ ئەوەی ئەسپەکە چاوی لە خۆی نەبێت، ئیتر ئەوکات غار دەدات. مرۆڤ دەبێت پێ بنێت بە خۆیدا کاتێك دەبینێت لە مەسەلەیەکدا بە هەڵەدا چووە، بە تایبەت لە حوکم و باسێکی فیقهییدا، بە تایبەت زانایانی ئیسلام، زۆر جار دەبینیت جێبەجێکردنی حوکمێکی شەرعی کێشە دروست دەکات لە کۆمەڵگەیەکدا، زۆر سروشتییە کە زانایانی ئەو وڵاتە کۆببنەوو بڕیارێکی بوێرانە بدەن، بەڵام لە چوارچێوەی شەریعەت دەر نەچێت، لە نێو ئەو کولتوورە فیقهییەدا هەمیشە بەدیل (ئەلتەرناتیڤ) هەیە بۆ ئەو کێشانەی کە رووبەڕووی کۆمەڵگەی کوسڵمان دەبێتەوە.

٢ـ گۆڕانی زەمان: ئەمە جیاوازە لە گۆڕانی نەریت، گۆڕانکاریی لە زەمان پەیوەندیی بە رەفتاری خەڵکییەوە هەیە، بۆنموونە لەسەر دەمێکدا کە خەڵکیی ئەهلی ئەمانەت بوون، دەستپاك بوون، فێڵباز نەبوون، تەماشا دەکەیت حوکم بە جۆرێکە رەنگە پێویست نەکات هەموو قەرزێك لە دادگا تۆمار بکرێت، بەڵام ئێستا وای لێهاتووە تۆ دەبێت بڕۆیتە سەر ئەو رایەی کە دەبێت هەموو قەرزێك تۆمار بکرێت چونکە زەمانە گۆڕاوە.

٣ـ رەگەزەکانی بەرژەوەندیی (عنصر المصلحة): رەگەزەکانی بەرژەوەندییش بەڕاستیی زۆر گرنگە، هەرکات بەرژەوەندیی هەبوو لە بابەتێکدا ئەوە بواری نوێگەریی هەیە.

**کۆسپەکانی نوێگەریی:**

هەر بزووتنەوەیەکی نوێگەریی دەست پێدەکات بە خوێندنەوەی ئەو بزووتنەوانەی کە لە مێژوودا هەبوون دەستپێدەکات، چ بزووتنەوەیەکی فیکریی بن، چ سیاسیی و چ فیقهییش بن، کە قسەیەکی نوێیان پێبووبێت کۆمەڵێك کۆسپ لەبەردەمیاندا دروستبوون کە بریتیین لە:

١ـ دەمارگیریی: پێمان خۆش بێت و پێمان ناخۆش بێت خەڵك دەمارگیرییەکیان هەیە بۆ رابردوویان، تەنانەت زانایەك کە ئێستا زۆر رەخنەیان لێی هەیە سبەی کە وەفات دەکات حاڵەتێکی پیرۆزیی بۆ دروست دەبێت، خەڵك واز لە رەخنەکان دەهێنن هەر بە پیرۆزییەوە باسی دەکەن.

٢ـ تاکگەرایی: ئێمە کە سەیری فیقهی ئیسلامیی دەکەین دەبینین فیقهی تایبەت (خاص) زۆر گەشەی کردووە، ئەو باسانەی پەیوەندیی بە بوارەکانی: نوێژ، تەهارەت، زەواج و تەڵاق و..هتد زۆر گەشەی کردووە، بەڵام لە بواری فیقهی گشتییدا کە دەوڵەت دەبێت بە لایەنێکی بنچینەیی لە جێبەجێکردن و پارێزگاریکردنی هەست بە رەنجووریی دەکەین، هەست بەوە دەکەین فیقهی سیاسەت و دەوڵەت وەکو فیقهی تاك گەشەی نەکردووە، ئەمە مانای وایە فیقهی ئیسلامیی فیقهێکی تاکگەرایە، لە کاتێکدا تەماشا دەکەین ئەحکامی ئیسلامیی زۆربەی، ئەگەر نەشڵێین هەمووی کاتێك مەبەستەکەی خۆی دەدات بە دەستەوە کە بە شێوەیەکی کۆمەڵیی ئەنجام بدرێت، وەك: نوێژ، رۆژوو،

زەکات و حەج و..تد، کەواتە ئەم تاکگەراییە کۆسپە، چۆن کۆمەڵگە وا لێبکەین لەو عەقڵیەتی تاکگەراییەوە بەرەو عەقڵیەتی کۆمەڵگەرایی بڕوات.واتە دەوڵەتیش ببێتە لایەنێکی جێبەجێکردنی ئەحکامی شەرعی و بەرپرس بێت لە بەرجەستەکردنیدا.

٣ـ چاولێگەریی (تقلید): مەترسییترین کۆسپ لەبەردەم نوێبوونەوە گەشەکردنی فیقهی ئیسلامیی بریتییە لە: دابڕانی فیقه لە واقیعی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی، یانی فیقه کە پەیوەندی نەما بە واقیعی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە پێویست ناکات گەشەو نوێبوونەوە بکات، بەڵام چ کات پێویستمان بە نوێبوونەوە دەبێت؟ کە دامەزراوەیەکی فەرمی حکومی داوا لە فەقیهێك دەکات دەڵێت: ئێمە پێویستمان بە سیستمێکی بانکی هەیە کە ریبای تێدا نەبێت، ئەویش دێت دەگەڕێت بە ناو دەقەکاندا، بە ناو گەنجینەی فیقهیی خۆیدا، بە واقیعی سیاسیی و کۆمەڵایەتییدا، دێت توێژینەوەیەکی باش پێشکەش دەکات و تەرحی بەدیل دەکات، کە چۆن بانکێکی نا ریبایی دروست بکەین، کەواتە دابڕان لە واقیعی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی فیقه دەستەوسان دەکات، فیقه ئیفلیج دەکات، فەقیه دەکات بە کائینێك کە سەر بەم سەردەمە دەنەبێت.

٤ـ لایەنگریی مەزهەبێك لە لایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە: واتە لایەنگریی مەزهەبێك لە لایەن دەسەڵاتی سیاسییەوە دژ بە مەزهەبەکانی دیکە، یانی هەق بەوە بدات بە سیاسەتمەدار ببێتە فەقیه، سیاسەتمەدار بیەوێت کێشە فیقهییەکان یەکلا بکاتەوە بەبێ ئەوەی بۆ خۆی لە فیقه شارەزا بێت، ئەمە پێچەوانەی هەموو ئەخلاقێکی میهنیشە بەراستیی، لە مێژوودا دەبینین فەقیهی وامان هەبووە زۆر گرنگ بووە بەڵام فیقهەکەی گەشەی نەسەندووە، لەبەر

ئەوەی دەسەڵاتی سیاسیی پشتگیریی لێ نەکردووە، لە مێژووی ئیسلامییدا نموونەی زۆرمان هەیە لەو هەوڵانەی بۆ نوێکردنەوە دراون، لە ناو ئەهلی سوننەدا زۆر زۆرە، ئەسڵەن بووە بە بەدیهییەیەك لە ناو ویژدانی زانایان و ئەهلی سوننەدا کە هەر سەد ساڵ جارێك نوێکەرەوەیەك بێت، یان نوێگەرانێك بێن، سەیر بکەن لە کوردستان خۆشماندا ئەوەی زانا بێت داوای نوێگەریی دەکات، ئەوەی داوای ناکات لە مەسەلەکە دووروپەرتە.

**رێگاکانی نوێبوونەوەی فیقه:**

١ـ ماددەی فیقهیی: ئەو ماددە فیقهییەی باس دەکرێت و تەرح دەکرێت، ئەو ماددەی باسی لێ دەکرێت دەبێت ماددەی رۆژ بێت.

٢ـ سەرچاوەکان (المصادر): ئێمە دەتوانین هەندێك سەرچاوەی نوێ بێنین بۆ فەقیه، فەقیه زۆر پێویستی بەوەیە ئاگاداری کۆمەڵگەکەی خۆی بێت، ئاگاداری سیاسەتی چەرخی خۆی بێت، ئاگاداری زانستەکانی رۆژی خۆی بێت، (فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ) (النحل: ٤٣).

٣ـ بەیانی بەڵگە شەرعییەکان: ئێستا وەك جاران نییە هەر کەس داوای فەتوایەکت لێ دەکات دەبێت بەڵگەی شەرعیی بۆ بهێنیتەوە، ئەمە هۆشیارییەکی زۆر گرنگە و یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، کە بە شێوەیەکی تەعەببودی قسەی مامۆستایانی ئایینی وەرناگرن، دەبێت بەڵگەی شەرعییان بۆ بهێننەوە، کەوایە بەیانی بەڵگەی شەرعی یەکێکە لەو رێگەیانەی کە فیقهیان پێ نوێ دەبێتەوە.

٤ـ برەودان بە فیقهی بەراوردکاریی (الفقه المقارن): واتە کە مەسەلەیەك تەرح دەکرێت، هەر چۆن بێت رای مەزهەبەکانیش وەربگیرێت، چونکە وەك ئایەتەکە

دەفەرموێت: (فَبَشِّرْ عِبَادِ* الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ) (الزمر: ١٧–١٨).

٥- بەراورد کردن بە یاسا دانراوەکان: ئێستا ئەو بزاوتە رۆشنبیرییەی لە زانکۆکانداهەیە بە تایبەت زانکۆکانی کوردستان، کە باسێکی شەرعیی دەکرێت هەوڵ دەدەن بەراورد بکرێت بە یاسا دانراوەکان (القوانين الوضعية) لە هەموو ئەو دیراساتانەش کە کراوە بە ویژدانەوە سەیر دەکرێت شەرع کورتی نەهێناوە، بەڵکو ئەرجەحیەتیشی هەیە بەسەر ئەو رایانەی کە هێنراون.

٦- داهێنانی زانستێکی نوێ بە ناوی نەزەرییەی فیقه: چۆن نەزەریەی قانوون، ئەدەب، ئابووری، حەق و نەزەرییەی تر هەیە ئاواش پێویستمان بە نەزەرییەی شەرعیی، یان فیقهی هەیە، ئەمە بەڕاستیی زانستێکی نوێ و زۆر گرنگە، پەیوەندیی فیقه دەبەستێتەوە بە ئاسۆکانی مەعریفەی بەشەرییەوە.

٧- پۆلێنکردنەوەی بابەتە فیقهییەکان: ئێستا دەبینین زانستی یاسا پۆلینکردنی جوانی بۆ کراوە، زانایان هەوڵ دەدەن لە ژێر رۆشنایی ئەو پۆلێنکردنەدا پۆلێنی بابەتە فیقهییەکان بکەن، وەك چۆن قانوونی عام و قانوونی خاصمان هەیە، ئاواش فیقهی عام و فیقهی خاصمان دەبێت، قانوونی دەستوورییمان هەیە، فیقهی دەستوورییشمان دەبێت، قانوونی ئیدارییمان هەیە، فیقهی ئیدارییشمان دەبێت، نەزەریاتی سیاسییمان هەیە، نەزریاتی فیکری سیاسیی ئیسلامییمان دەبێت.

٨- نووسینی فیقه بە پێی تێگەیشتنی ئاستە جیاوازەکانی خەڵك لە کۆمەڵگەدا: هەمانە دەبێت ئاستەکانی زۆر سەرەتایی بێت، هەشمانە بەرز و بەرزتریش تا دەگاتە ئاستە بەرز بەرزەکانی کۆمەڵگە، ئەمەش دیارە کاتی خۆی زاناکان لەسەر ئەو بنەمایە کتێبیان داناوە، کتێبیان داناوە تەنیا بۆ

زانایان، بۆ نموونە کتێبی (المنهاج) ئیمامی نەوەوی تەنیا بۆ زانایان دایناوە، بۆ ئەو کەسانەی داناوە کە گەشتوونەتە ئاستی ئیفتا، بۆ موبتەدی و قوتابی دانەنراوە، بەڵام ئێستا بووە بە کتیبێکی دەرسی.بۆ ئەوانەی کە زۆریان ماوە ببن بە موفتی، بۆیە زۆر سەخت و دژوارە و بە بێ راڤەکردن و لێکدانەوەی زانایان نازانرێت.

٩ـ لابردنی بابەتە کۆنەکان کە ئێستا بوونیان نییە: تەنانەت ئەو نموونانەی کە بوونیان نییەو هەرگیز روونادەن.

**مەرج و پێشمەرجەکانی نوێبوونەوە:**

ئەڵبەت هەموو نوێگەرییەك پێیستی بە زەوابیت هەیە، بەتایبەتی نوێگەری لە فیقهی ئیسلامیدا، کە بێگومان ئەم بابەتەش دوو مەرجی سەرەکی هەیە:

یەکەم: دیاریکردنی ئەو شتانەی کە قابیلی نوێکردنەوەن، چونکە هەندێك شت هەیە پێویستی بە تازەگەریی نییە، رووگە (كعبة) ئەگەر نوێی بکەیتەوە نرخەکەی لە کیس دەدات، دەبێت هەر دێرین (عتيق) بێت (البيت العتيق)، رۆژ،مانگ، ئەمانە نوێ ناکرێنەوە، ئەمە ئەو بوارەیە پێی دەوترێت (الثوابت) دەبێت دیاریی بکرێت جیگیرەکان چییە بە تایبەت لە عێراقدا کە دەوترێت نابێت یاسایەك دەربچێت پێچەوانەی جیگیرەکان (الثوابت)ی ئیسلام بێت، بەڵام خەڵك نازانێت جێگیرەکان چییە. هەندێك بابەت و پرسیش هەن کە بواری نوێکردنەوەیان تێدا هەیە، کە پێیان دەگوترێت: (المتغيرات).

دووەم: پابەند بوونی ئەوانەی پێی هەڵدەستن بە نیزامەکەوە: واتە بوونی موجتەهیدی زانای پابەند و خاوەن مەبەستی مسوڵمان. واتە پێویستمان بەوە نییە رۆژهەڵاتناسێك بێنین پێمان بڵێت ئەوە باشەو ئەوە خراپە، ئەوە لادەن و

ئەوە بهێڵنەوە، تەنانەت لە کۆڕا (الاجماع)یشدا بە مەرج گیراوە ئەوەی دەچێتە ئیجماعەوە دەبێت موجتەهید و ئوممەتی موحەممەد بێت (درووودی خوای لێبێت). لە هەمان کاتدا پێویستە ئەو موجتەهیدە وێڕای شارەزایی لە شەریعەت بە دەق و بنەما و ڕێگاکای ئیجتیهاد، شارەزای کۆمەڵگا و واقیعی ژیان بێت و جۆش بخوات لە گەڵ پرس و بابەتە زیندووەکانی ڕۆژ.

ئەڵبەت باسەکە زۆرتر هەڵدەگرێت بەڵام من گوزەرێکی خێرام پێدا کرد.

تێبینی: لە کۆتایی سیمینارەکەدا، کۆمەڵێك لە ئامادەبوان موداخەلەیان کرد و باسەکانی نێو سیمینارەکەیان دەوڵەمەندتر کرد، بەڵام بەهۆی گرفتی هونەرییەوە لەم نامیلکەیەدا ئاماژەیان پێنەدراوە.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئصیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لە پێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلامەوە.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەتی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازیی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەتی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوەژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتیی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر، لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستیی.

– هاوكاریی هەوڵ و كۆششی زانا توێژەرەوەكانی زانكۆ و بنكەكانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوكردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەكان.

– ئاڕاستەكردنی توێژینەوە زانستیی و ئەكادیمییەكان لە پێناو خزمەتكردن بە فیكر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێكی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبیی و ئیسلامییەكان و وڵاتانی تریش هەیە، كە لە ڕێگەیانەوە كار و چالاكییە جۆراوجۆرەكانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێكەوتننامەیەكی لەگەڵ ژمارەیەك زانكۆی عەرەبیی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوكاریی زانستی هاوبەش هەیە.



د. صەباح بەرزنجی، د. ئەحمەد بالیسانی، هاوژین عومەر بەڕێوەبەری سیمینارەکە



ئامادەبوانی سیمینارەکە لە کاتی پێشکەشکرنی وتەکەی دکتۆر ئەحمەد بالیسانیدا